# کوورتەیەک لە ژیانی
# هێمن موکریانی



**دێم هەتا هەمبێ بڕست و بیر و هۆش**
**گەر گلاشم، کوردەواری و ئێوە خۆش!**

**ئامادەکردنی: زریان سەرچناری**
**هەڵەچن: گرووپی ڕوون**
**ساڵی ٢٠٢٢**

(مامۆستا هێمن)ی شاعیری ناوداری کورد ناوی تەواوی محەمەدئەمین، کوڕی سەید حەسەنی شێخولیسلامی موکرییە، دایکی ناوی زەینەب، کچی شێخی بورهانە.
هەروەها بە (مامۆستا هێمن)، (هێمن موکریانی)، (مام هێمن)یش ناسراوە.

خۆیشی ناوی هێمنی لە هۆنراوەکانیدا بەکارهێناوە وەک زۆربەی هۆزانەوانەکان:

گوارەکەی زێڕت بەکار نایە، لە گوێ بگرە قسەم
لایقی گوێی تۆ عەزیزم، شێعری سادەی هێمنە

هێمن لە ساڵی ١٩٢١ لە گوندی(لاچین)ی نزیک شاری مەهاباد لە دایکبووە. هەر بە منداڵی دەخرێتە بەر خوێندن و چەند ساڵ لە قوتابخانەی (سەعادەت) لە شاری مەهاباد دەخوێنێت.

وێنەی خوێندنگەی سەعادەت:



مێژووی مەدرەسەی " سەعادەت " یەکەم مەدرەسەی شاری مەهاباد

پاشان باوکی لە قوتابخانە دەریدەهێنێت و دەینێرێت بۆ (خانەقای شێخی بورهان)بە مەبەستی ئەوەی کە لە دوارۆژدا ببێتە مەلا و جێی مەلا جامی، باپیرە گەورەی، بگرێتەوە.

دواتر دەینێرێت بۆ گوندی کولیجە و لەوێ لای مامۆستا مەلا ئەحمەدی فەوزی درێژە بە خوێندن دەدات. ساڵ و نیوێکیش لای فەوزی دەخوێنێت و لەوەوە شارەزایی لە زمان و ئەدەبی کوردیدا پەیدادەکات و هەستی شاعیریی چەکەرە دەکات. فەوزی خۆشەویستیی نیشتمان و نەتەوە لە ناخیدا دەچێنێت.

ساڵی ١٩٣٨ کە تەمەنی دەگاتە ١٧ساڵی دەست لە خوێندن هەڵدەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ گوندی شیلاناوێ. بە ڕۆژ لەگەڵ باوکیدا بە کشتوکاڵ و شەوانیش خۆی بە خوێندنەوەی پەرتووک و گۆڤار و ڕۆژنامەی فارسییەوە خەریک دەکات.

وردەوردە هاتوچۆی مەهاباد دەکات و لەگەڵ کۆمەڵە لاوێکی هۆشیار و ئازادیخواز دەبێتە هاوڕێ. ئەو لاوانە پەرتووک و گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردییان گیردەکەوێت و بۆ خوێندنەوە دەیاندەن بە (هێمن)یش.

ساڵی ١٩٤١ لە پاڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییدا دەست بە شیعرنووسین دەکات و هێدیهێدی شیعرەکانی لە دەفتەرێکدا دەنووسێتەوە. بەڵام باوکی پێی خۆش نابێت کوڕەکەی بە شیعر نووسینەوە خەریکبێت و ببێتە شاعیر، بۆیە کاتێک دەفتەری شیعرەکانی هێمنی دەکەوێتە دەست، دەمودەست دەیسووتێنێت و لێی زویر دەبێت و سەرزەنشتی دەکات.

ساڵی١٩٤١ لە کێڵگەکەی خۆیان دەبێت لە پڕێکدا دوو فڕۆکە پەیدا دەبن و بەیاننامە فڕێدەدەنە خوارێ. کاتێک هێمن دانەیەکی لەو بەیاننامەیە دەستدەکەوێت و دەیخوێنێتەوە، دەبینێت بە زمانی کوردی نووسراوە. ئیدی لە خۆشییاندا شاگەشکە دەبێت.

جارێک هێمن لە تەورێز دەبێت. کاتێک بۆ مەهاباد دەگەڕێتەوە، لە ڕێگای (عەبدولڕەحمان زەبیحی)یەوە پەیوەندیی بە (کۆمەڵەی ژێ-کاف) واتا: ( کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان)ەوە دەکات و ناوی نهێنیی هێمن بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت.

هێمن وەک ئەندامێک و وەک شاعیرێکی نیشتمانپەروەر لە دووەم ژمارەی گۆڤاری نیشتمانەوە هەتاکوو دوازمارەی بە شیعر و وتار بەشدارییدەکات.

**وێنەی گۆڤاری نیشتمان، زمانحاڵی کۆمەڵەی ژێکاف:**




**دواتریش لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کۆماری کوردستاندا وتار و شیعر دەنووسێت و ئەرکە حزبییەکانی خۆیشی ئەنجامدەدات. هەروەها لە بۆنە و کۆبوونەوەکاندا بەردەوام شیعر دەخوێنێتەوە و جۆشوخرۆش دەخاتە ئەو بۆنانەوە. هێمن لە ساڵی ١٩٤٦دا لەگەڵ کچی خاڵی خۆی بە ناوی (ئایشە) هاوسەرگیری دەکات و خێزان پێکدەهێنێت. بەرهەمی ئەو هاوسەرییە کوڕێک دەبێت و ناوی دەنێن (سەلاح).**

**وێنەی هێمن و سەلاحی کوڕی:**



**دوای ئەوەی کۆماری کوردستان دەڕوخێت. هێمن خۆ دەگەیەنێتە لای خاڵی، شێخ محەمەدی کوڕی شێخی بورهان، و لە خانەقای شێخی بورهان دەمێنێتەوە. بەو جۆرە لە گرتن و زیندان ڕزگاری دەبێت.**

**وێنەی سەرۆککۆماری کوردستان و هێمن و هەژار:**



ساڵی ١٩٤٧ هێمن لەگەڵ تێکۆشەرێکی هاوڕێیدا بەرەو شارۆچکەی قەڵادزێ بەرێدەکەون. کاتێک هێمن دەگاتە قەڵادزێ، پۆلیس دەیگرێت. دوو کەس بەبێ ئەوەی هێمن بناسن لە چنگی پۆلیس ڕزگاری دەکەن. یەکێک لەو دوو کەسانە مەلایەک دەبێت، هێمن دەباتە لای خۆی و ماوەیەک وانەی پێ دەڵێتەوە و لای خۆی دەیپارێزێت.

دوای ماوەیەک بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی کوردستان تاڕادەیەک ئارام دەبێتەوە. ئیتر هێمنیش دەگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکاری خۆی و دەست بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی دەکاتەوە. هێمن لەپاڵ ئیشوکاری ڕۆژانەیدا بە خوێندنەوەی هەندێک بڵاوکراوە خۆی سەرگەرم دەکات.

دەستەیەک لاوی تێکۆشەر لەسەر بۆچوونی هێمن بڕیاردەدەن کە دەست بە دەرکردنەوەی ڕۆژنامەی کوردستان بکەن.

وێنەی ژمارە یەکی کوردوستان:


بەنیوی خودای بەرزوبی هاوتا

کوردوستان

| آبونمان | |
|---|---|
| یەکساله ٣٠٠ | ریال |
| شەش‌مانگە ١٦٠ | ریال |
| دانەی ١ | ریال |

کوردوستان لە لایەن هەیئەتی تحریریە دەر دەچی

بلاو کەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردوستان

زمارەی ١ — سالی یەکەم — پینج شەمو ٢٠ - ١٠ - ١٣٢٤ — ١١- زانویە ١٩٤٦

# آمانجی ایمه

لەم‌کاتەدا کەخاکی کوردوستان لە هەمو وەختێك زیاتر پیویستی فیداکاری کورەکانیەتی .
لەو آنەدا کەهەمو نەتەوەکانی گیتی بو راگرتن، بوودەس هینانی سەربەستی و آزادی خویان وە بو وەدەس حستنی وسائلی پیش کەوتنی هاو- نیشتمانەکانیان دە تەقەلادان .
لەم وەختەدا کەهەمو نەتەوکانی عالەم غەیر از سەربەستی و گەورەبی نیشتمانەکەیان آمانجیکیان

و دەستی بەستراومان کراوە چاوی نستومان وە خەبەر هات . کومەلیك لە لاوان وگەنجانی کوردوستان کوبونەوە دەستی‌برایەتی ویەکیەتیان دادەس یەك بیوچان سەعیان بەخەرج دا تا حزبی دیموکراتی کردوستانیان‌بەوجود هینا و هەر بەر هەلست و خائنیك کە لەناو کوردوستاندا هەبو لە نیویان هەلگرت ؛ حزبی‌دیموکرات

# ژنرالیسموس ستالین

(بەبونەی شصت وشەشەمین سالی لەدایك بونی)

یوسف آستالین پیشوای گەورەی رنجبەران وکارگەرانی گیتی ورهبری میللەتەکانی اتحاد جماهیری شورەوی سوسیالیستی لە ٢١ دسامبر

**سەرنجام ماڵومنداڵی خۆی جێدەهێڵێت و ڕوو لە چیاکانی کوردستان دەکات. ماوەیەک لەگەڵ هەژار موکریانی شاعیر پێکەوە دەژین.**

**وێنەی مامۆستا هەژار و مامۆستا هێمن:**



**هەر لەو کاتەدا لە باشووری کوردستانیش یەکێتیی نووسەرانی کورد دادەمەزرێت. هێمن وەک شاعیر و نووسەرێکی خاوەن هەڵوێست و کوردپەروەر بە ئەندام وەردەگیرێت و لە زۆربەی کۆڕ و کۆبوونەوە و بۆنەکانی ئەو ڕێکخراوەدا هەڵدەسووڕێت و لە گۆڤار و بڵاوکراوەکانیشیدا شیعر و وتاری ئەدەبی بڵاودەکاتەوە.**

**کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ دەست بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی دەکات و بەشێکی لێ دەخاتە سەر کاغەز. بەناوی (لە کوێوە بۆ کوێ) لە ساڵی ١٩٧٤ دا لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی دەبێتەوە.**

**ئیتر هەموو ئەمانە پێکەوە لە هاوینی ساڵی ١٩٧٤دا لە پەرتووکێکدا بە ناوی تاریک و ڕوون چاپدەکرێن و دەخرێنە بەردەستی خوێنەرانی کورد.**

**وێنەی بەرگی تاریک و ڕوون:**




**پەرتووکی تاریک و ڕوون لەلایەن لاوان و ڕووناکبیرانەوە دەقۆزرێتەوە و وەک دیارییەکی بەنرخ دەیخوێننەوە و وتووێژی لەسەر دەکەن. هاوکات چەند نووسەر و شاعیر بیروڕای خۆیان دەربارەی دەنووسن و مشتومڕێکی گەرم دەخوڵقێنێت.**

**سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ هێمن وەک هەر تێکۆشەرێکی کوردی ئاوارە، حەزی گەڕانەوە بۆ نێو کەسوکار و خێزانی خۆی دەکەوێتە سەری. هەر بۆیە هێمنیش بڕیاری خۆی دەدات و لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بەڕێدەکەون.**

**ڕۆژی ٢٠-٠٢-١٩٧٩ دەگاتە سەردەشت و لەگەڵ پێشوازییەکی گەرمدا لە ماڵی چەند دۆست و ناسیاو دەمێنێتەوە. هاوکات تەلەفۆن بۆ مەهاباد دەکەن و هەواڵی گەڕانەوەی هێمن بە کەسوکاری و خەڵکی مەهاباد ڕادەگەیەنن.**

## وێنەی هێمن لە ناو ئاپۆڕای خەڵکی ڕۆژهەڵات:




ئەو هەواڵە خۆشە لەو دەمەدا زۆر بە خێرایی لەنێو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە. دەستەدەستە لاوان و ڕووناکبیران و خەڵک خۆ سازدەدەن بۆ پێشوازیکردن لە هێمن. دەمودەست (سەلاح)ی کوڕی لەگەڵ کۆمەڵێک خزم و دۆست بەرەو سەردەشت دەکەونە ڕێ.

ساڵی ١٩٧٩هێمن لەگەڵ خزم و کەسەکانی و کۆمەڵێک لە خەڵکی سەردەشت بەرەو مەهاباد بەڕێ دەکەوێت. کۆمەڵکۆمەڵ خەڵک بە ئوتومبێل دێن بەپیریەوە و دەیکەنە ڕۆژی شایی و ئاهەنگ.

دەمەوعەسری ئەو ڕۆژە کاتێک کەژاوەی ئوتومبێلەکان دەگەنە نزیک مەهاباد، تێکەڵ بە کۆڕی شیعرخوێندنەوە و شایی و هەڵپەڕکێ دەبن و هەموو بە چاوی پڕ لە فرمێسکی شادییەوە پێشوازیی لە هێمن دەکەن و بۆ نێو مەهابادی دەبەنەوە.

چەند ڕۆژ کۆمەڵکۆمەڵ و دەستەدەستە خەڵک لە شار و شارۆچکە و دێهاتەکانی کوردستانەوە بۆ سەردانی هێمن بەرەو مەهاباد دەچن و بەردەوام ماڵی هێمن پڕ لە میوان و دۆستان دەبێت. ئیدی لەو ساتەوە ماڵەکەی وەک بنکەیەکی ئەدەبیی لێ دێت و دەبێتە جێی شیعر و باسی ئەدەبی و شوێنی بەیەکگەیشتنی ئەدیبان و ڕووناکبیران.

**ئێستاش کراوە بە مۆزەخانەیەکی ئەدەبی بە ناوی (سەرای هێمن):**




**بەدرێژایـــی ســـاڵانی ١٩٧٩-١٩٨٦ هـــێمن لە زۆربەی کـــۆڕ و کۆبـــوونەوە و بۆنەکانـــدا لە شارەکانی سنە، کرماشان، ورمێ و مەهاباد... چالاکانە بەشداریی دەکـات و بە شیعر و وتـاری جوان ئەو بۆنانە ڕازاوە دەکات.**
**سـەرەتای سـاڵی ١٩٨٣ لەگەڵ چەنـد شـاعیر و نووسـەردا وتـووێژ دەکـات و پێیـان دەڵێـت بـا بە هەموومـان هەوڵبـدەین دەزگـایەکی چاپەمەنی سـاز بکەیـن و گۆڤـار و ڕۆژنـامە و پەرتـووکی کوردیی تێدا چاپبکەین. بنکەیەک بە ناوی ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی- ئینتیشـاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی لە ورمێ دادەمەزرێنن و گۆڤارێک بە ناوی (سروە) دەردەکەن.**

**وێنەی هێمن لە بەردەم (ئینتیشاراتی سەڵاحەددین)**




**لەوبارەیەوە دەفەرموێت:**

**سروە هات خونچە گوڵی باخی ئەدەب پشکووتن**

**بـاخەوانـی گەرەکـە تـازە جـەوان من چبکەم؟**



هەتاکوو هێمن خۆی لە ژیاندا دەبێت، چوار ژمارە لەو گۆڤارە دەردەکەن. ئینجا دەست بە چاپکردنی هەندێک پەرتووک دەکەن و وردەوردە کارەکانیان گەشە پێ دەدەن و بەنیاز دەبن زیاتریش گەورە و فراوانی بکەن. بەڵام لە گەرمەی کارکردنیاندا شەوی ١٨ لەسەر ١٩-٠٤-١٩٨٦ لە شاری ورمێ هێمن کۆچی دوایی دەکات.

**وێنەی کێلی گۆڕی هێمن:**




بەرەبەیانی ڕۆژی شەممە ١٩-٠٤-١٩٨٦ تەرمەکەی بەرەو مەهاباد بەڕێ دەکرێت.
پاشنیوەڕۆی هەمان ڕۆژ لە مەراسیمێکی پڕشکۆدا و لەنێو ئاپۆرەی جەماوەردا لە گۆڕستانی (بوداق سوڵتان) بەخاک دەسپێردێت.

کیژ و کوڕ بگرن لە دەوری گۆڕی هێمن ڕەشبەڵەک
من کە شینگێڕی شەهیدانم لە کوێ شینم دەوێ

سەرچاوەکان:

سایت: سایتی کوردیپیدیا

پەرتووک: لەکوێوە بۆ کوێ؟ پێشەکی تاریک و ڕوون